

# أدعية النبي ﷺ

## دوعاكانی پێغەمبەر ﷺ

بە کوردی کردنی

ڕەنجدەر سیامەند خالند

# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: " أدعية النبي دوعاكانى پێغەمبەر(ﷺ) "
بە کوردی کردنی: "ڕەنجدەر سیامەند خالند"
دیز اینی ناوەوە: " عبدالله خاکی "
دیز اینی بەرگ: " باوکی عبدالرحمن"

ژمارە ( )ی ساڵی ( )ی
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان پێدراوە

# بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ. يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ و أنتُمْ مُسلِمونَ.

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً و اتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً.

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فازَ فَوزاً عَظيماً..

أمَّا بعدُ: فإنَّ اصَدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدِي هَدْيُ محمدٍ صلى الله عليه وسلم، وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ،وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

الحمدلله وحده والصلاة والسلام على من لا نبي بعده, دوعاكردن بريتييه لەيەكێك لە گەورەترينى ئەو شتانەی کەئينسانى موسوڵمان پێ لەخواى گەورە نزيک دەبێتەوە، خواى گەورە دەفەرمووێت: [وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ][1] واتە: ئەی محمد (ﷺ) ئەگەر بەندەكانى من پرسيارى منيان لێت كرد ئەوە من لێيانەوە نزيكم بە زانست و زانيارى و بيستن و بينين و تواناو دەسەڵات و ويست و ئيرادە، بەڵام زاتى پيرۆزى خواى گەورە لەسەر عەرشە، هەر كەسێك لە من بپاڕێتەوە ئەوا وەڵامى ئەدەمەوە يان ئەوەتا بۆى جێبەجێ ئەكەم، يان بە ئەندازەی ئەوە بەڵاو موسيبەتى لەسەر لائەدەم، يان لە قيامەتدا پاداشتى ئەدەمەوە. وە دوعاكردن عيبادەتە، هەروەكو چۆن پێغەمبەرى خوا (ﷺ) دەفەرمووێت: (الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ)[2] واتە: دوعاكردن عيبادەتە. هەر بۆيە دوعاكردن هەم عيبادەتەو هەميش دەبێتە هۆى ئەوەى ئينسان پێويستيەكانى جێ بەجێ بێت لەلايەن الله تعالى، لەم ناميلكە بچوكە،

[1] ـ البقرة ١٨٦
[2] - [سنن أبو داود: ١٤٧٩]

کەسوودم لەکۆمەڵێک نامیلکەو دوعاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەرگرتووە بەگرینگم زانی ئەو دوعایە گرینگانەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پێی پاڕاوەتەوە، بیکەم بەکوردی و تەعلیقیش لەسەر فەرموودەکان بدەم بەجۆرێک بۆ هەر فەرموودەیەک ناو نیشانی دوعاکەم داناوە، جار وایە دوعاکە هەر بەیەک ناو نیشان کۆتایی نایێت، بەڵکو کۆمەڵێک شتی تر و بابەتی جۆراو جۆر لەخۆ هەڵدەگرێت، هەروەها ئەو فەرموودانەی کە لەئیسنادەکەی لاوازی هەیە دیاریم کردووە، وە دیاریم کردووە بۆچی ئەم دوعایانە کراوە، بۆیە ئەو نامیلکە جیاواز لەنامیلکەکانی ترەو خوێنەر شتی نوێ دەبینێت، مەبەستمان لەدانانی ئەم نامیلکەیە ئەوەیە ئینسانی موسوڵمان پێویستە بەو دوعایانە بپاڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی پاڕاوەتەوە، چونکە شوێن کەوتنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) واجبە، گومانیش لەوە نییە دوعای هیچ یەکێک هێندەی دوعاکانی پێغەمبەر (ﷺ) کاریگەری وای نییە، دوعاکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تایبەتن و هەردوو دیوی قیامەت و دونیا لەخۆ هەڵدەگرن، هەر لە تەوحید و ئولوهیەت و ڕبوبیەت و هەموو ئەو خاسیەتانە لەخۆ هەڵدەگرێت کە بەندە پێویستە بەرامبەر الله تعالى، دەری ببڕێت و دانی پێدا بنێت، جا دان پێدانانێک کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دانی پێدا نابێ دەربارەی الله تعالى بێگومان فراوانتر و گەورەترە،

هەر بۆیە موسوڵمانی ژیر پێویستە بەو دوعایە جوانانەو گەورانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بپاڕێتەوە ئەگەری گیرابوونی دوعاکانی زۆر زیاترەو هەمیش ئیقتیدایە بەپێغەمبەری خوا(ﷺ)، جا لەکۆتایی داواکارم الله تعالى بەشوێنە کەوتەی ئەو پێێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) قەبووڵمان بکات و وامان لێبکات هەموو شتەکانی ژیانمان چاو لێکەری بێت بست بە بستێ لەپێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ)، الله تعالى بیکاتە صەدەقەی جاریەو ئەو کەسەشی دەیخوێنێتەوەو پەیڕەوی دەکات، بۆی ببێتە مایەی خێرو خۆشی هەردوو دونیا، آمین

**براتان: ڕەنجدەر سیامەند خالند**

**٢٠/ رمضان ١٤٤١**

**چوارشەممە**



# {سەركردەی زیكرەكان}

﴿ اللَّهُمَّ أنْتَ رَبي لَا إِلَهَ إِلِّا أَنْتَ، خَلَقْتنَي وَأنَا عَبدُكَ، وَأنَا عَلىَ عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْـتَطَعْتُ, أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لي فَإِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ ﴾[١].

واته: خوایه تۆ پەروەردگارمیت و هیچ پەرستراوێكیش نییه كه شایستەی پەرستن بێت جگه له تۆ، دروستت كردووم و منیش بەندەی تۆم، خودایه من لەسەرپەیمان و بەڵێنەكەی خۆمم كه به تۆم داوه تا چەنده له توانامدا بێت، خوایه پەنات پێدەگرم له شەڕ وخراپەی ئەوەی كه ئەنجامم داوه، خوایه دان بەوەدا دەنێم كه تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم، دانیش به تاوانەكانمدا دەنێم و داوای لێ خۆش بوونت لێ دەكەم، هیچ كەسێكیش له تاوانەكان خۆش نابێت جگه له تۆ.

[١] - رواه البخاري (٦٣٠٦) عن شداد بن أوس . پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوزیكرەی بەسەركردەی زیكرەكان وەسف كردووه وه دەفەرمووێت: هەركەسێك بەیانیان بەیەقینەوه ئەم زیكره بخوێنێت، ئەو ڕۆژه بمرێت دەچێته بەهەشتەوه، وەئەگەر ئێواره بیخوێنێت ئەوه ئەوشەوه بمرێت دەچێته بەهەشتەوه.

# {پاڕانەوەیەکی گرینگ}



**﴿ اللَّهُمَّ إنيِّ ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إنَّك أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾[1].**

واتە: خودایە بەڕاستی ستەمێکی زۆروگەورەم لە خۆم کردووە و هیچ کەسێکیش لە تاوانەکان خۆش نابێت، جگە لە تۆ نەبێت، لێم خۆش ببە لێخۆش بوونێک لە لایەن خۆتەوە، ڕەحمم پێ بکە بەڕاستی تۆ لێخۆشبووو میهرەبانیت.

[1] - رواه البخاري (٨٣٤) ومسلم (٢٧٠٥) عن أبي بكر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) ئیمامی ئەبو بەکر گوتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پاڕانەوەیەکم فێربکە لەنوێژدا بیکەم، پێغەمبەریش ئەو پاڕانەوەی فێرکرد.

## {دوعا بۆ ئەو کردەوانەی بە ئەنقەست کردوتە}

﴿ رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾[1].

واتە: خوایە لەتاوانەکان و نەزانیم خۆش ببە، هەروەها لە زیادەڕەوی لەهەموو کارەکانم و ئەوەشی کەتۆ پێی زاناتری لەمن، خوایە لەڕاست و گاڵتەکانم خۆش ببە، لەهەڵەو و ئەنقەستەکانم لەوەش کەلای منە خوایە لەوەی لەمەو پێش کردوومە، وە لەوەی لەوەو دواش خۆش ببە، لەوەی کە بەنهێنی و ئاشکرا کردوومە و لەوەی کە لەمن زاناتری پێی، تۆ پێش خەری و دواخەری تۆ بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتت هەیە.

[1] رواه البخاري (٦٣٩٨) ومسلم (٢٧١٩) عن أبي موسى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). باوکی ئەبو موسا دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو پاڕانەوەیە دەپاڕاوە.

# {داوای لێخۆشبوون لە هەموو تاوانەکان گەورەو بچووکی}

﴿ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ، وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ، وَآخِرَهُ، وَعَلَانِيَتَهُ، وَسِرَّهُ ﴾[1].

واتە: پەروەردگارە لەهەموو گوناهەکانم خۆش ببە، کەم و زۆری، سەرەتا وکۆتایی، ئاشکرا ونهێنی.



[1] - رواه مسلم (٤٨٣) عن أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). ئەبو هورەیرە دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو پاڕانەوەی لەسوجدەدا دەگوت.

## {پەنا گرتن لە خەم و پەژارە و بێتاقەتی}



**﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ ﴾[1].**

واتە: پەروەردگارە من پەنات پێدەگرم لە خەم و پەژارە و بێتاقەتی و بێ توانایی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و ترسنۆکی و زۆری قەرزداری و زاڵبون و دەسەڵاتی کەسانی نەزان و نەفام لەفیتنەدا.



[1] - رواه البخاري (٦٣٦٩) عن أنس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

## {پەناگرتن لە ڕەزیلی و ترسنۆکی و پیری}



﴿اللَّهُمَّ إني أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُرَدَّ إِلى أَرْذَلِ الْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ﴾[١].

واتە: خودایە پەنات پێدەگرم لە ڕەزیلی، پەنات پێدەگرم لەترسنۆکی، پەنات پێدەگرم لەوەی کە بکەومە تەمەنی پیری و پەککەوتەییەوە، پەنات پێدەگرم لە ئاشوبەی دونیا و سزای ناوگۆڕ.



[١] - رواه البخاري (٦٣٦٥) سەعدی کوڕی وەققاص فەرمانی بە پێنج شت دەکرد، وەباسی دەکرد و دەیگێڕاوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی کردووە بەو پاڕانەوەیە.

## {پەناگرتن لەقەرزاری و فیتنەکان}

﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْفَقْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ﴾[1]. واتە: خوایە من پەنات پێدەگرم لەتەمبەڵی و پیری وە پەنات پێدەگرم لەگوناهـ ولەقەرزاری، پەنات پێدەگرم لە لەفیتنەی گۆڕ، لەفیتنەی ئاگرو سزای ئاگر، لەشەڕو فیتنەی دەوڵەمەندی، هەروەها پەنات پێدەگرم لەفیتنەی هەژاری، پەنات پێدەگرم لەفیتنەی مەسیحی دەجال، خوایە گوناهـ و تاوانەکانم بەئاوی بەفرو تەرزە بشۆوە، دڵم پاك بکەوە لەگوناهـ هەروەك پۆشاکی پیس لەچڵك پاك دەکەیەوە، هەروەها نێوان من و هەڵەکانم لەیەکتر دوور بخەوە وەك چۆن دوریت خستۆتە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

[1] - رواه البخاري (٦٣٦٨) ومسلم (٥٨٩) دایکمان عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو پاڕانەوانە دەپاڕایەوە لەنوێژدا بەو پاڕانەوەیە دەپاڕاوە.

# { پەناگرتن لە زیانی ئەوانەی جڵەویان بەدەست خوای گەورەیە }

﴿ اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الْأَرْضِ وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ ﴾[1].

واتە: خوایە ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، ئەی پەروەردگاری هەموو شتێك، ئەی تەقێنەری دانەوێڵەو ناوك و سەوزکردنی، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنات پێدەگرم لەشەڕو زیانی هەموو ئەو دروستکراوانەی خۆت کە جڵەویان بەدەست تۆیە، خوایە

[1] - رواه مسلم (٢٧١٣). ئەبو هورەیرە (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەفەرمووێت: کاتێك رسول الله (ﷺ) دەچووە سەرجێگای خەوتنەکەی ئەم دوعایەی دەفەرموو.

هیچ شتێك لەپێشەوەی تۆ نەبووە، وەتۆ کۆتایی و لەدوای تۆ هیچ شتێك نامێنێت لەدوای لەناوچوونی هەموو دروستکراوەکان و بەهێز و بەتوانایت، هیچ شتێك لەسەرووی تۆوە نییە، هەموو دروستکراوەکان پێویستیان بەتۆیەو کەسیش نییە هاوشێوەی تۆ بێت، خوایە قەرزاریمان لەسەر لابەرەو دەوڵەمەندیشمان بکە لەهەژاری.



# {پەناگرتن بەخوای گەورە لەشەڕی خراپەی ڕابردوو و داهاتوو}



﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ ﴾[1].

واتـــە: خوایـــە پـــەنا دەگـــرم بـــەتۆلەخراپـــەی ئـــەو کاروکردەوانـــەی کـــە لـــەڕابردوو کـــردوومن، وەلەخراپـــەی ئەوکاروکردەوانەی کە لەداهاتوودا دەیانکەم.



[1] - رواه مسلم (٢٧١٦) فەروەی کوڕی نەوفەل دەڵێ پرسیارم لە عائیشە کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەچ دوعایە لەخوای گەورە دەپاڕایەوە ؟ عـائیشـەش گوتی بەم دوعایە دەپاڕایەوە.

# {داواكردنی ئاینداریەكی چاك و چاكردنی قیامەت}

﴿ اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَأَصْـلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ ﴾[١].

واتە: خوایە ئاینداریەكی چاكم پێ ببەخشە كە كاروكردەوەكانم لەهەڵە بپارێزێ، دونیاشم بۆ چاك بكە كە ژیانمی تێدایە، قیامەتیشم بۆ چاك بكەی چونكە گەڕانەوەم بۆ ئەوێیە، ژیانم بۆ بكەی بەهۆكاری زۆر كردنی هەموو خێرو چاكەیەك مردنیشم بۆ بكەی بەهۆی حەسانەوە لەگشت خراپەیەك.

[١] - رواه مسلم (٢٧٢٠) عن أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

## {داواكردنی هیدایەت}

﴿ اللَّهُمَّ إِنيِّ أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى ﴾[1].

واتە: خوایە من داوای هیدایەت و تەقواو داوێن پاكی و دەوڵەمەندیت لێدەكەم.



[1] - رواه مسلم (٢٧٢١) عن ابن مسعود (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

# { پەناگرتن بەخوای گەورە لەنەمانی ناز و نیعمەت و توش بوون بەسزای خوای گەورە }



﴿ اللَّهُمَّ إني أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ ﴾[1].

واته: خوایه پەنا دەگرم بەتۆ لەنەمانی نازو نیعمەتەکانت، وە پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی لەپڕ توشی تۆڵەی سەختی تۆ ببم، وەلەهەرچی شتێ کەدەبێتە هۆی توڕەیی تۆ.



[1] - رواه مسلم (٢٧٣٩) عن ابن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

# { پەناگرتن لە پەککەوتەی و تەمبەڵی و ڕەزیلی و داواکردنی تەقوا }

﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ، اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا، أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ، وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا ﴾[1].

واتە: خوایە من پەنادەگرم لەپەککەوتەیی و تەمبەڵی، لەترس و ڕژدی (ڕەزیلی) و پیری، لەسزاو ئازاری ناو گۆڕ،خوایە تەقواو خواپەرستی بەنەفسم ببەخشەو خاوێنی بکەوە، تۆ چاکترین خاوێنکاری، تۆ پشتیوان و خاوەنی ئەویت، خوایە من پەنا دەگرم بەتۆ لەزانستێك کەسوودی نەبێت، دڵێك کە ملکەچ نەبێ، لەنەفسێك کەتێر نەبێت، لەدوعایەك کە گیرا نەبێ(قەبوڵ نەبێ).

[1] - رواه مسلم(٢٧٢٢) زەیدی کوڕی ئەرقەم گوتی هیچتان پێناڵێم ئیلا ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەیگوت، پێغەمبەری خوا ئەم دوعایەی دەگوت.

## {پشت بەستن بە خوای گەورەو پەناگرتن لەگومڕای}

﴿ اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ، اللَّهُمَّ إِنيِّ أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي، أَنْتَ الْحَيُّ الَّذِي لَا يَمُوتُ وَالْجِنُّ وَالْإِنْسُ يَمُوتُونَ ﴾[١].

واتا: خوایە خۆم تەسلیمی تۆکردووە وبڕوام تەنها بەتۆ هەیە تەنها پشت بەتۆ دەبەستم و بۆلای تۆ دەگەڕێمەوەو بەتۆ سەردەکەوم بەسەر دوژمنەکانم، خوایە پەنا دەگرم بە گەورەیی تۆ، هیچ خوایەك نییە تەنها تۆ نەبێت، داوات لێدەکەم کە گومڕام نەکەیت تۆ ئەو زیندووەیت کە هەرگیز نامرێت، جنۆکەو مرۆڤەکان دەمرن.

---

[١]- رواه البخاري (٧٣٨٣) ومسلم (٢٧١٧) عن ابن عباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما).

# { پەناگرتن بەخوای گەورە لەهەڵگەڕانەوەی دڵ }



﴿ اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ الْقُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنَا عَلَى طَاعَتِكَ ﴾[1].

واتە: ئەی خوای گەورەی بگێڕی دڵەکان، دڵمان بگێڕە بۆ گوێڕایەڵی و پەرستنی تۆ.



[1] - رواه مسلم (٢٦٥٤) پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرموویەتی: دڵی نەوەی ئادەم هەمووی لە نێوان دوو پەنجە لەپەنجەکانی خوای گەورەو مێهرەبان دایە وەکو یەک دڵ، چۆنی بوێت وای لێدەکات، پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ)ئەم دوعایەی فەرموو.

## { پەناگرتن بەخواى گەورە لەبەڵاى زۆر و بەخت ڕەشى و تووش بوون بەناخۆشى }



﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ وَدَرَكِ الشَّقَاءِ وَسُوءِ الْقَضَاءِ وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ ﴾[1].

واتە: خوايە پەنات پێدەگرم لەبەڵاى زۆر، وەلەبەخت ڕەشى وتووشبوون بەناخۆشى، وەزۆربوونى دوژمن.
(دڵ خۆشى دوژمنان بەوناخۆشيەى توشى بەندە دەبێت).



[1] - رواه البخاري (٦٣٤٧) ومسلم (٢٧٠٧) عن أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

## { داواكردنی هیدایەت بۆ ڕێگای حەق بەهۆی جیاوازی بوونی خەڵكی }



﴿ اللَّهُمَّ رَبَّ جَبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ ﴾[1]. واته: خوایه ئەی پەروەردگاری جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان زەوی، زانا بەنهێنی و ئاشکراکان، تۆ حوکم دەکەیت لەنێوان بەندەکانتدا لەوشتەدا کە جیاوازن تیایدا، سا ڕینماییم بکە بۆ ئەو حەقەی کە خەڵك تیایدا جیاوازن بە ئیزنی خۆت، چونکە خۆت کێت ویست ڕێنمایی دەکەیت بۆ سەرڕێگای ڕاست.

---

[1] - رواه مسلم (٧٧٠) عبدالرحمان ی کوڕی عەوف (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێ لەعائیشەم پرسی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) پێغەمبەر (ﷺ)بەچی شەونوێژی دەست پێدەکرد ؟ وتی: کاتێك پێغەمبەری (ﷺ)هەڵدەستا بۆ شەونوێژسەرەتا بەم پاڕانەوەیە دەستی پێدەکرد.

## {پەناگرتن لەخەشم و سزای خوای گەورە}



**﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ ﴾[1].**

واتە: خوایە من پەنا بەڕازی بوونت دەگرم لەخەشم وقینت، پەنا بە لێبوردنەکانت دەگرم لە سزاکانت، پەنا دەگرم بەخۆت لە خۆت، من ناتوانم سوپاس و ستایشت بکەم بەو ئەندازەی، کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

[1] - رواه مسلم (٤٨٦) دایکمان عائیشە دەفەرمووێت: شەوێك لەسەرجێگای خەوتن پێغەمبەرم (ﷺ) لێ ون بوو، منیش بۆی گەڕام لەمزگەوت بوو دەستم کەوت لەبەری پێی پێیەکانی درێژ کردبوو لەمزگەوت بوو، ئەم دوعایەی دەفەرموو(لەڕیوایەتێك تر دەڵێ لە سوجدەدا بوو)(سنن أبو داود(٨٧٩)، (سنن الترمذي(٣٤٩٣)، ( سنن النسائي(١٦٩)، موطأ مالك(٥٧١) وهەروەها لەڕیوایتێکی تردا هاتووە دەڵێ: لەرکوعدا بوویان لەسوجدە( مسند أحمد(٢٥١٧٨).

# { داواکردنی نور و ڕوناکی }

﴿ اللَّهُمَّ اجْعَلْ لِي فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي لِسَانِي نُورًا، وَفِي سَمْعِي نُورًا، وَفِي بَصَرِي نُورًا، وَمِنْ فَوْقِي نُورًا، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا، وَعَنْ يَمِينِي نُورًا، وَعَنْ شِمَالِي نُورًا، وَمِنْ بَيْنِ يَدَيَّ نُورًا، وَمِنْ خَلْفِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا، وَأَعْظِمْ لِي نُورًا ﴾[1].

[1] - رواه البخاري (٦٣١٦) ومسلم (٧٦٣) ابن عباس دەڵی شەوێکیان لای پورە مەیمونە مامەوە، شەو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستا چووە دەرەوە بۆ سەرئاو، ئینجا دەست و دەم چاوی شۆردو هاتەوە خەوتەوە، ئینجا هەستایەوە، هاتە لای کونە ئاوەکەی، دەستنوێژێکی مام ناوەندی گرت کەزۆر پێیەوە خەریك نەبوو، بەڵام دەستنوێژێکی تەواو بوو ئینجا هەستاو دەستی کرد بەنوێژ کردن، منیش هەستام و خۆم کێشایەوە، بۆ ئەوەی ئەو وانەزانێ کە بەئاگابووم و ئاگام لێی بووە، دەستنوێژم گرت ئەو هەستایەوە بۆ نوێژ، منیش لەلای چەپیەوە ڕاوەستام، بەڵام دەستی گرتم و خستمیە لای ڕاستییەوە، نوێژی ئەو شەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)بە سیانزە ڕکات تەواو بوو، پاشان ڕاکشاو نوست هەتا پرخەی لێوە هات پێغەمبەر(ﷺ) کە دەخوت پرخەی دەهات، ئینجا بیلال هات ئاگاداری کرد کە کاتی نوێژە هەستاو دەستیکرد بە نوێژکردن ودەستنوێژی نەگرت لەپاشان ئەم پاڕانەوەی گوت.

واتە: خوایە نورو ڕوناکی بخەرە دڵمەوە، ڕوناکی بخەرە بینینمەوە، ڕوناکی بخەرە بیستنمەوە، ڕوناکی بخەرە لای ڕاستمەوە، ڕوناکی بخەرە لای چەپمەوە، ڕوناکی لەسەرمەوە، ڕوناکی لەژێرمەوە، ڕوناکی لەبەردەمما، ڕوناکی لەپشتمەوە، ڕوناکی لەدەرونمەوە، ڕوناکی گەورە و فراوان بکە بۆم.



# {داواکردنی خێر و پەناگرتن لەخراپەی ئێستاو داهاتوو}

﴿اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَاذَ بِهِ عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ وَأَسْأَلُكَ أَنْ تَجْعَلَ كُلَّ قَضَاءٍ قَضَيْتَهُ لِي خَيْرًا﴾[1]

واتە: خوایە من داوای خێرت لـێ دەکەم هەرهەموویی هی ئێستاو داهاتووش ئەوەی کە دەیزانم وئەوەشــی کە نایزانم، وە پەنات پێ دەگرم لە هەمووخراپەیەك هی ئێستاوداهاتووش ئەوەی کە

[1] - رواه ابن ماجه (٣٨٤٦) بإسـناد صحيح عن عائشـة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا). أم كلثوم (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) دەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەودوعایەی فێری عائیشە کرد (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا).

دەیزانم و ئەوەشـی کە نایزانم ، خوایە من داوای ئەوخێرەت لـــێ دەکەم کە بەندە و پێغەمبەرەکەت داوای لێ کردوویت، وە پەنات پێ دەگـرم لەو خـراپەیەی کە بەنـدە و پـێـغـەمـبەرەکەت پەنـای پـێ لــێگرتووە، خوایە من داوای بەهەشتت لــێدەکەم و ئەوەشی کە نزیك کەرەوەیە لــێی لە هەرگوفتارو کردارێك، وە پەنات پێدەگرم لە ئاگرو ئەوەشی کە نزیك کەرەوەیە لێی لە هەرگوفتارو کردارێك، وە داواشـت لـــێدەکەم هەربڕیارێك کە بڕیارت لە سـەرداوە بۆم بە خێر بیگێڕیت.



## {داواكردن لەخوای گەورە بەناو سیفاتەكانی}



﴿ اللَّهُمَّ بِعِلْمِكَ الْغَيْبَ وَقُدْرَتِكَ عَلَى الْخَلْقِ أَحْيِنِي مَا عَلِمْتَ الْحَيَاةَ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا عَلِمْتَ الْوَفَاةَ خَيْرًا لِي، اللَّهُمَّ وَأَسْأَلُكَ خَشْيَتَكَ فِي الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، وَأَسْأَلُكَ كَلِمَةَ الْحَقِّ فِي الرِّضَا وَالْغَضَبِ، وَأَسْأَلُكَ الْقَصْدَ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنَى، وَأَسْأَلُكَ نَعِيمًا لَا يَنْفَدُ، وَأَسْأَلُكَ قُرَّةَ عَيْنٍ لَا تَنْقَطِعُ، وَأَسْأَلُكَ الرِّضَاءَ بَعْدَ الْقَضَاءِ، وَأَسْأَلُكَ بَرْدَ الْعَيْشِ بَعْدَ الْمَوْتِ، وَأَسْأَلُكَ لَذَّةَ النَّظَرِ إِلَى وَجْهِكَ وَالشَّوْقَ إِلَى لِقَائِكَ فِي غَيْرِ ضَرَّاءَ مُضِرَّةٍ وَلَا فِتْنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللَّهُمَّ زَيِّنَّا بِزِينَةِ الْإِيمَانِ، وَاجْعَلْنَا هُدَاةً مُهْتَدِينَ ﴾[1].

---

[1] - رواه النَّسائي (١٣٠٥) بإسناد حسن عن عمار بن ياسر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). عمار دەفەرمووێت: ئەو دوعایەم لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بیستوە. هەروەها ئەم دوعایە كۆمەڵێك سیفەتی هەرەگەورەی لەخۆگرتووە وەكو تەوحید و توكل و ئارامگرتن و تەوەسولكردن بەسیفاتەكانی الله تعالى، هەروەها ترسان لە الله تعالى, وە زۆرشتی تریش. ئیمامی ابن رجب ڕاڤەیەكی زۆرجوان و بەهێزی بۆ ئەم دوعایە

واتە: خوایە بۆ خاتری سیفەتی غەیب زانیت، وە بۆ خاتری سیفەتی تواناو دەسەڵاتت بەسەر دروست کراوەکانت، بمژیێنە ئەگەر ژیان باشتر بێت بۆم، وە بمرێنە ئەگەر مردن باشتر بێت بۆم، خوایە من داوای ترسانت لێدەکەم لە پەنهانی و ئاشکرادا، داوای وتەی حەقت لێدەکەم لەکاتی ڕەزامەندیم و توڕەبوونم، وە داوای نێوەندگیریت لێدەکەم لەکاتی هەژاری و دەوڵەمەندیم، وەداوای نازو نیعمەتێکت لێدەکەم کە کۆتایی نەیێت، وەداوای خۆشبەختیەك و خۆشیەکت لێدەکەم کە کۆتایی نایەت، وەداوای ڕازی بونت لێدەکەم لەپاش ئەو بڕیارەی کەبۆت داوم، وەداوای ئاسانکاریت لێدەکەم لەدوای مردن، وەداوای خۆشی بینینی خۆت وگەیشتن بەلیقای تۆ دەکەم بەبێ هیچ تەنگو چەڵەمەیەك و بەڵایەکی کوشندەو تاقیکردنەوەیەکی گومڕاکەر، وە بمانگێڕە لەوکەسانەی کەهیدایەت دراون وخەڵکیش هیدایەت دەدەن.

کردووە بگەڕێوە سەرڕاڤەکە: (مجموع رسائل ابن رجب) : ص (١٧٣) ، (١ / ١٦٤)، (١ /١٧٣)، (١ / ١٨٠).

## {داوای پاراستن و سەلامەت بوونی عەقیدە}



﴿ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي وَآمِنْ رَوْعَاتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنَ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي ﴾[1].

واته: خوایه داوای لێخوشبوون و پارێزگاریت لێدەکەم لەدونیاو لەدواڕۆژدا، خوایه داوای لێخۆشبوون وپارێزگاریت لێدەکەم لەدین ولەدونیاو خانەوادە و ماڵ و سامانمدا، خوایه عەیب و ناتەواوی و کەم و کورتیەکانم داپۆشە، خوایه ترسەکانم هێور بکەرەوەو دڵە ڕاوکێم مەهێڵە، خوایه لەپێش ولەپاش ولای ڕاست وچەپ ولای

[1] - رواه أبو داود (٥٠٧٤) وغيره بإسناد صحيح عن ابن عمر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). ابن عمر دەڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هیچ ئێوارەوبەیانیەك وازی لەم پاڕانەوەیە نەهێناوە.

سەرروومەوە پارێزگاریم لێ بکە،(و اتە: لەهەموو ڕوویەکەوە بم پارێزە لەدردو بەڵای خراپ) خو ایە پەنا دەگرم بەتۆ لەژێرمەوە سزا بدرێم بەڕۆچوون بەزەویدا لەناو بچم.



## {داننان بەتاك دانانى خواى گەورە (التوحيد)}

﴿ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ ﴾[١].

واتە: خوايە ئەى بەديهێنەرى ئاسمانەكان وزەوى، ئەى زانا بەهەموو نهێنى و ئاشكرايەك، ئەى پەروەردگارو پادشاى هەموو شتێك، شايەتى دەدەم كەهيچ پەرستراوێك نييە بەهەق جگە لەتۆ، پەنا دەگرم بەتۆ لەخراپەى نەفس و دەروونم، هەروەها لەشەڕو خراپەى شەيتان وهاوتا دانانى.

[١] - سـنن أبو داود (٥٠٦٧) وغيره بإسـناد صـحيح عن أبي هريرة (رَضِـيَ اللَّهُ عَنْهُ). ئەبو هورەيرە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو بەكر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وتويەتى: ئەى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) چەند وشەيەكم فێر بكە هەتا بەيانيان و ئێواران بيانخوێنم پێغەمبەريش(ﷺ) ئەم پاڕانەوەى پێگوت.

# { داوای جێگیر بوون لەسەر ڕێگای حەق }



﴿ اللَّهُمَّ إِنيِّ أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فيِ الأَمْرِ، وَالْعَزِيمَةَ عَلىَ الرُّشْدِ، وَأَسْأَلُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَأسأَلَكُ شُكْرَ نعِمَتِكَ، وَحُسْنَ عِبادَتِكَ، وَأسأَلُكَ قَلْبًا سَلِيمًا، وَلِسَانًا صَادِقًا، وَأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا تَعْلَمُ، إِنَّكَ أَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ ﴾[1].

واته: خوایه داوای جێگیر بون وبەردەوام بوونت لێدەکەم لەسەردین، داوای عەزیمەتت لێدەکەم لەسەرڕێگای ڕاست وئیمان، وە داوای ڕەحمەتی زۆر وگەورەت لێدەکەم، وە

[1] - رواه الطبراني في "الكبير" (٧١٣٥) عن شداد بن أوس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). إسناده ضعيف . بەشێك لەزانایان ئەوفەرموودەیان بەلاوازداناوە، چونکە لەسەنەدەکەی کەسێکی نادیاری تێدایە بەناوی (الحنظلي) سەیری (تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي٥/ ٤١١)بکە، وە بەشێکی کەمیش بەحەسەنیان داناوە.

داواى لێخۆشبونت لێدەكەم، داواى سوپاسكردن لەسەر نیعمتەكانت و جوانى پەرستشت لێدەكەم، وەداواى دڵێكى سەلامەت و زمانێكى ڕاست بێژت لێدەكەم، وە داواى ئەو خێرانەت لێدەكەم كە خۆت دەیزانى، وەپەنات پێدەگرم لەشەڕى ئەو شتانەى تۆ دەیزانى و من نایزانم، وەداواى لێخۆشبونت لێدەكەم لەو زیادەڕەویانەى كردوومەو تۆ دەیزانى، بەڕاستى تۆزاناى نهێنیەكانى.



# {داواكردنى ڕزقى حەڵاڵ و پەناگرتن لەحەرام}



﴿ اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ ﴾[1].

واته: خوايه به حەڵاڵى خۆت تێرم بكەو بێنيازم بكه لەحەرامت تا مەجبورى نەبم و به فەزڵى خۆت دەوڵەمەندو بێ نيازم بكه لەغەيرى خۆت.

[1] - رواه الترمذي (٣٥٦٣) عن علي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). إسناده ضعيف. ئيمامي ترمذي ئەم فەرموودەى بەحەسەن داناوه بەڵام سەنەدى ئەم فەرموودەيه لاوازه كەسێكى تێدايه بەناوى (عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ إِسْحَاقَ الْقُرَشِيِّ) زانايان بەلاوازيان داناوه ئيمامى بوخارى له (الضعفاء) دەفەرمووێت: فيه نظر. الضعفاء للبخاري:(ص٨٣) هەروەها هەموو زانايانى فەرموودە ناسى ئەوكەسەيان بەلاوازداناوه هەيه به (منكر الحديث) ى داناوه وەكو أبو حاتم الرازي غەيرى ئەويش.

# {داوای یارمەتی لەسەر تەقواو الله پەرستی}



﴿ رَبِّ أَعِنِّي وَلاَ تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلاَ تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلاتمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الْهُدَى لِي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّارًا، لَكَ ذَكَّارًا، لَكَ رَهَّابًا، لَكَ مِطْوَاعًا، لَكَ مُخْبِتًا إِلَيْكَ أَوَّاهًا مُنِيبًا، رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي وَاغْسِلْ حَوْبَتِي وَأَجِبْ دَعْوَتِي وَثَبِّتْ حُجَّتِي وَسَدِّدْ لِسَانِي وَاهْدِ قَلْبِي وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ صَدْرِي ﴾[1].

واته: خوایه یارمەتیم بدە واته: "یارمەتیم بدە یادی تۆ بکەم سوپاست بکەم بەچاکی بت پەرستم " یارمەتی کەس مەدە دژی من واته: " یارمەتی کەسێ مەدە ڕێگریم لێ بکات لەفەرمانبەرداری و گوێڕایەڵیت لە شەیاتینی ئادەمیزاد وجنۆکە" سەرم بخە " واته:

[1] - رواه الترمذي (٣٥٥١) وغيره بإسناد صحيح عن ابن عباس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما).

بەسەر کافر اندا" سەریان مەخە بەسەرما، مەکرم بۆ بکەو مەکرم بەسەردا مەکە، ڕێنمایم بۆ ئاسان بکە، سەرم بخە بەسەرئەو انەی زوڵم و ستەمم لێدەکەن، وام لێبکە هەمیشە سوپاس گوزارت بم، زۆریادت بکەم، زۆرلەتۆبترسم، گوێڕایەڵ و فەرمانبەردارت بم، زۆر ملکەچت بم، زۆر بۆلای تۆ بگەڕێمەوە، خو ایە وام لێبکە شکایەتی حاڵی خۆم هەرلای تۆ بکەم، خو ایە تەوبەو پەشیمانیم لێ وەربگرە، تاو انەکانم بسڕەوە، پاڕانەوەکانم لێ قەبوڵ بکە، بەڵگەکانم بچەسپێنە، دڵم ڕێنمایی بکە، زمانم ڕاست بێژبکە، ڕق و کینەی دڵم لابەرەو دڵم ساف و بێگرد بکە.



## {پەناگرتن بەخواى گەورە لەشەڕى بێباوەڕان}



﴿ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لَا قَابِضَ لِمَا بَسَطْتَ، وَلَا بَاسِطَ لِمَا قَبَضْتَ، وَلَا هَادِيَ لِمَا أَضْلَلْتَ، وَلَا مُضِلَّ لِمَنْ هَدَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُقَرِّبَ لِمَا بَاعَدْتَ، وَلَا مُبَاعِدَ لِمَا قَرَّبْتَ، اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا مِنْ بَرَكَاتِكَ وَرَحْمَتِكَ وَفَضْلِكَ وَرِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ الْمُقِيمَ الَّذِي لَا يَحُولُ وَلَا يَزُولُ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ الْعَيْلَةِ، وَالْأَمْنَ يَوْمَ الْخَوْفِ، اللَّهُمَّ إِنِّي عَائِذٌ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا أَعْطَيْتَنَا وَشَرِّ مَا مَنَعْتَ، اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْإِيمَانَ وَزَيِّنْهُ فِي قُلُوبِنَا، وَكَرِّهْ إِلَيْنَا الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ، وَاجْعَلْنَا مِنَ الرَّاشِدِينَ، اللَّهُمَّ تَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ، وَأَحْيِنَا مُسْلِمِينَ، وَأَلْحِقْنَا بِالصَّالِحِينَ غَيْرَ خَزَايَا وَلَا مَفْتُونِينَ، اللَّهُمَّ قَاتِلْ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَاجْعَلْ

عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ، اللَّهُمَّ قَاتِلْ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَهَ الْحَقِّ ﴾[1].

واتە: خوایە هەموو سوپاس و ستایشێك بۆتۆ، هیچ ڕێگریەك و تەسکیەك نییە لەوەی کەفراوانت کردووە لەڕەحمەتی خۆت، وە هیچ فراوانیەك نییە لەوەی کە تەسکت کردۆتەوەو ڕێگری لێ، وە هیدایەتیش بۆکەسێك نییە کەخۆت گومڕات کردبێ، وەکەسێکیش گومڕا نابێ کە هیدایەت دراو بێت، خوایە بەخشەر نییە بۆ ئەو شتەی کەتۆ دەیگریتەوە، خوایە ڕێگر نییە لەو شتەی کەتۆ دەیبەخشی، وە هیچ نزیکیەك نییە بۆ ئەو شتەی کەدوورت کردۆتەوە، وەهیچ دووریەك نییە بۆ ئەو شتەی کە نزیکت کردۆتەوە، خوایە ڕەحمەت و بەرکەت و فەزڵ و ڕزق و ڕۆزیت بەسەرمان فراوان و زۆر بکە، خوایە من داوای نیعمەتێکی نەبڕاوەی بەردوامت لێدەکەم، خوایە من داوای نیعمەتی ڕۆژی تەنگانەو هەژاریت لێدەکەم، (واتا: موحتاجی دەستی هیچ کەسێکم نەکەی) وە داوای

[1] - رواه الإمام أحمد (١٥٤٩٢) عن رفاعة الزرقي بإسناد صحيح. (صحيح الأدب المفرد للبخاري، برقم (٥٣٨). ڕیفاعەی کوڕی زورەقی دەڵێ: کاتێك کە جەنگی ئوحود ڕوویداو بێباوەڕان گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم دوعایەی خوێند.

ئەمن و ئەمانت لێدەکەم لەڕۆژی ترسناك، خوایە پەنام بەتۆ گرتووە لەخراپەی ئەوشتەی کە پێت داوین دەبێتە هۆ ئەوەی کە گوناهی پێ بکەین و حەق و مافی تۆی لێنەدەین، وە پەنات پێدەگرم لەخراپەی ئەوشتەی کەپێت نەداوین (جاروایە ئینسان حەسوودی بەکەسێك دەبات کە شتێکی پێدراوەو ئەوپێی نەدراوە ئەوەش خراپەیە بۆیە پەنای پێگیراوە)، خوایە ئیمانمان لەلا خۆشەویست بکەو لەدڵەکانمان بیڕازێنەوە، وە بێبڕوایی و فاسقی و تاوان لەلامان ناشرین و بێزراو بکە، وەلەوکەسانەمان بگێرە کە هیدایەتت داون و ڕاگیراوت کردوون لەسەر عیبادەتی خۆت، خوایە لەسەر ئیسلام و موسڵمانێتی بمان مرێنە، وەبمان ژیێنە لەسەر ئیسلام و موسڵمانێتی، وەبمان گەیەن بە پیاوچاکان، بەبێ هیچ زەلیلیەك و تاقی کردنەوەیەك کە ببێتە هۆی گومڕا بوون، خوایە بێباوەڕان ئەوانەی کە پێغەمبەرانت بەدرۆ دەخەنەوەو بەرگریو ڕێگری دەکەن لەڕێگای تۆ لەناو ببە، وە سزاو تۆڵەی هەرگەورەی خۆت بەسەریان بسەپێنە، خوایە بێباوەڕان ئەوانەی کە کیتابیان پێدراوە لەناو ببە ئەی پەروەردگاری بەحەق.

# {داوای سەلامەت بوونی بەشەکانی جەستە}



﴿ اللَّهُمَّ عَـافِنِي فِي بَـدَنِي، اللَّهُمَّ عَـافِنِي فِي سَمْعِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ ﴾[1].

واتە: خوایە ساغ و سەلامەتیم پێ ببەخشە لەجەستەو بیستن بینینم دا، هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ، خوایە پەنات پێدەگرم لەبێ باوەڕی و هەژاری، هەروەها پەنات پێدەگرم لەسزای ناو گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق جگە لەتۆ.

[1] - رواه أبو داود (٥٠٩٠) بإسناد حسن عن أبي بكرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ). لەئیسانەدەکەی پیاوێك هەیە بەناوی (جَعْفَرُ بْنُ مَيْمُونٍ) کەزانایان بەلاوازیان داناوە. فەرموودەکە دەڵێ: (عبدالرحمان ی کوڕی ئەبو بەکرە دەڵێ بەباوکم وت: من گوێم لێتە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك سێ جار دەپاڕێیەوەو ئەم دوعایە دەڵێی، ئەویش گوتی: گویم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)) بووە هەموو بەیانی ئێوارەیەك سێ جار دەیخوێند، بۆیە منیش حەزدەکەم شوێن سوننەت و ڕێبازی ئەو بکەوم و بیکەمە سەرمەشقی خۆم).

# { چۆنیەتی سەڵاوات لێدان }

﴿ اللَّهُمَّ صَــلِّ عَلىَ مُحَمَّـدٍ وَعَلىَ آلِ مُحَمَّـدٍ كَمَا صَــلَّيْـتَ عَلىَ إِبْرَاهِيمَ وعَلىَ آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّـكَ حَمِيـدٌ مَجِيـدٌ، اللّهُمَّ بَـارِكْ عَلىَ مُحَمَّـدٍ وَعَلىَ آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلىَ إِبْرَاهِيمَ وَعَلىَ آلِ إِبْرَاهِيم إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ﴾[١].

واتە: ئەی خوایە بەرەکەتی خۆت بڕژێنە بەسەر موحەممەد دا، وەك چۆن ڕژاندووتە بەسەرئالی ئیبراهیم دا، ئەی خوایە خێروبەرکەتی خۆت بۆسەرموحەممەد وئالی موحەممەد زیاد بکە، وەك چۆنت کردووە بۆئالی ئیبراهیم، بەڕاستی تۆسوپاس کراووگەورەیت.

١ - رواه البخاري (٣٣٧٠) ومسلم (٤٠٦) عن كعب بن عُجرة. وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانت پێکردووین کە چۆن سەڵاوات لەسەرلێبدەین یان سڵاوت لێ بکەین، سەبارەت بەسەلام بەڕاستی ئەوە زانیمان، ئەدی سەڵاوات لێدان چۆنە؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی بڵێن...

# { داوای بەخشین و خێر و چاكە لە دونیا و دواڕۆژ }



﴿ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾[1]

واتە: پەروەردگارا لە دنیادا خێرو چاكەو نازو نیعمەتمان پێ ببەخشەو، لە قیامەتیشدا لە نازو نیعمەتەكانی بەهەشت بەهرەمەندمان بكەو، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.



[1]- رواه البخاري(٦٣٨٩) ئەنەس رضي الله عنه، دەڵێ زۆترین پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەمە بوو.

# پێرست

